ژیاننامەی

# موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب

نووسینی

عبدالعزيز بن عبدالله بن باز

وەرگێڕانی

إحسان برهان الدين



# پێشەكی وەرگێڕ

یەكێك لە بوارە گرنگەكانی نووسین، خستنەڕووی ژياننامە و مێژووی پياوچاك و بانگەواز و چاكسازانە، چونكە دەتوانين پەند و ئامۆژگاری زۆريان لێوەربگرين و، بيانكەينە پێشەنگ بۆ خۆمان.

لەڕاستيدا تەمەنی مرۆڤ لەسەر ئەم زەوييەدا زۆر كورتە بە بەراورد لەگەڵ تەمەنی مرۆڤايەتی و، ئەوەندەش كە تەمەنی ژيان ماوە لە دونيادا، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت جگە لەم شەست حەفتا ساڵەی لەسەر زەويدا دەژێت، تەمەنی خۆی سەدان و هەزاران ساڵ درێژ بكاتەوە، ئەوەش بێگومان لەڕێگەی كاری چاكە و بڵاوكردنەوەی چاكە و نووسين و ئامۆژگاری و ئاراستەی چاكە، چونكە ئەگەر بێت و مرۆڤ لەو ژيانە كورتەی كە خوای گەورە پێی بەخشيوە كردارێك بەئەنجام

نەگەیەنێت بۆ دەورووبەری و کەسێکی ئیجابی نەبێت لە ژیانیدا، لەپاش مردنی فەرامۆش دەکرێت و وەکو پێویست ڕەحمەت و نزا و پاڕانەوەشی پێ ناگات، بێگومان خوای گەورەش وزە و تواناو بەهرەکانی بەپێی دادگەری ڕەهای خۆی دابەش کردووە، بەپێی هەوڵ و کۆشش و لەخۆبوردەیی مرۆڤەکانیش پشکیان لە تەمەن درێژی و ناوبانگ مانەوەی پاش مردن دەمێنێتەوە.

جا ئەم ناودارەش کە لێرەدا ژیاننامەی دەخەینە ڕوو، کە لە بنچینەدا موحازەرەیەکی شێخ (ابن باز)ە ڕەحمەتی خوای لێبێت، یەکێکە لە زانا و چاکساز و کەڵە پیاوانی ئیسلام، کە لە ڕاستیدا توانی ببێتە یەکێك لەو کەسانەی خوای گەورە لەسەر دەستیان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ی زیندوو کردەوە، ئەوەش یەکێکە لە بەڵگەکانی

پاراستنی خوای گەورە بۆ ئایینەكەی كە پیاوانی لەو جۆرە دەرەخسێنی ئەركی بانگەواز و جیهاد و ناساندنی ئیسلام لەئەستۆگرن، بەدرێژایی مێژووش هەرچەند موسوڵمانان تووشی قۆناغی سەخت و نەهامەتی و زاڵبوونی نەفامی بوبێتن، خوای گەورەش-وەكو لە فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺدا ئاماژەی پێكراوە-لەسەر هەموو سەد ساڵێكدا زانایایەك دەنێرێت ئایین بۆ خەڵكی تازە كەنەوە و، پاك و بێگەردی سوننەت بگێرنەوە ( يأتى على رأس كل مائة عام من يجدد لهذه الأُمة أمر دينها).

شێخ موحەممەدیش لەڕاستیدا لەبارودۆخ و كەش و هەوایەكدا پەیدا بوو كە ئوممەت لە ئەوپەڕی پێویستیدا بوو بۆ كەسێكی وەكو ئەو پێوەرەكانی هەق و ڕاستی جارێكی تر بگێڕێتەوە جێگەی ڕاستی خۆی و، خەڵكی لە خەوی

غەفڵەت و دوورکەوتنەوە لە شەریعەت ڕاچەڵەکێنێت، ئەگەر خوای گەورەش بە میهرەبانی خۆی زانایانی بۆ ئەو ئەرکە قورس و پیرۆزە ئامادە نەکردبا، خەڵکی بە سرووشتی خۆیان لە ئایین دووردەکەوتنەوە و سوننەت لە نێوانیاندا نامۆ دەبوو، بەڵام خۆشبەختانە هەرچی ستەمکاران و کینە لە دڵانی سەرزەوی هەیە ناتوانن زیان بەم ئایینە بگەیەنن یان ناشیرینی بکەن، هەر بۆیە ژمارەی موسوڵمانان بەدرێژایی سەدەکان و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە برەو و زیادبووندایە.

داواکارم خوای گەورە ئەم نووسینە بکاتە مایەی سوود بۆ موسوڵمانان و بیکاتە قورسایی لە تەرازووی کردەوەکانی شێخ (ابن باز) ڕەحمەتی خوای لێبێت، هەروەها بۆ وەرگێڕەکەی بۆ زمانی

كوردی كە هیواداره لە خوێنەری ئەم بابەتە لە نزا و پاڕانەوەی چاكە بێ بەشی نەكات.

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات.

إحسان برهان الدين 2010/12/4

ihsanburhan@yahoo.co.uk

# پێشەکی مامۆستا "عطية محمد سالم"

یەکێك لە هۆکارەکانی مانەوەی بانگەواز، بەدوای یەکدا هاتنی بانگخوازانە بە درێژایی ڕۆژگار، لەو ڕۆژەشەوە خوای گەورە فەزلّ و چاکەی خۆی ڕژاندە سەر ئەم ئوممەتە و، ئایینی بۆ موسولّمانان تەواو کرد، دەنگی بانگ خوازان هەمیشە هەر بەرزە بۆ گەیاندنی ئەم ئیسلامە، هەر لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و تاکو ئەم سەردەمەی خۆمان وەکو کارکردنێك بە بنچینەی ئەم ئایەتە پیرۆزە (ﮕ ﮖ ﮗ ﮘ ﮙ ﮚ ).

هەرکاتێك پەڵە هەوری ڕەشی بیدعە باڵی کێشابێتە سەر خەڵکیدا و، تاریکی نەفامی تەشەنەی کردبێت و، خەڵکی ملیان نابێتە دەریای ناهەقەوە، خوای گەورە ئەم ئایینەی بە

پیاوانێك پشتگیری كردووە كە بانگەواز دەكەن بۆ لای ئایینەكەی بە ئەوپەڕی بەرچاوڕوونی، ڕێگە ڕووناك دەكەنەوە، هەق دەردەخەن و، سوننەتی پێغەمبەر ﷺ زیندوو دەكەنەوە و، دژایەتی بیدعە دەكەن تا ئەوكاتەی خوای گەورە وڵات لەسەر دستیان پاراو دەكاتەوە و، بەهۆی بانگەوازەكەیانەوە بەندەكان ڕزگار دەكات، ئەوەش تەواو كردنی نیعمەت و فراوانی فەزڵ و چاكەی خوای گەورەیە بەسەر بەندەكانیەوە.

بیركەرەوە و زانایانیش هەمیشە گرنگی بە ژیاننامەی ناوداران و زانایان دەدەن، بەتایبەتی ئەوانەی كە ڕووی مێژوویان گۆڕیوە لە وڵاتەكان و، توانیویانە كودەتایەك درووست بكەن لە شێوازی بیركردنەوە، بۆیە ژیاننامنەی ئەو كەسانە وەكو چرا و مەشخەڵانە بە هەردوو لای

ڕێگەدا، بۆئەوەی خەڵکی لە ڕووناکیاندا ڕێ بکەن.

جا ئەگەر کەسانێك هەبن هۆشمەندان و زانایان مەزن ڕابگرن بەدەر لە ئاڕاستە و ڕێڕەویان، لەوانەشە پەیکەریان بۆ درووست بکەن، ئێمەی موسوڵمان کەسایەتیەکان پیرۆز ڕاناگرین و بە (مقدس)یان نازاین، بەڵام هەندێك پێوەرمان هەیە کە هەڵقڵاوی بانگەوازی ئیسلامە، هەموو کەسایەتیەك و کردەوەکەی بەو پێوەرانە دەناسیتەوە، بۆیە هەرچەند ئەو کەسایەتیانە بە پێی ئەو پێوەرانە ڕێ بەن، ئەوەندە پلەوپایەیان لە ناو دڵماندا گەورە تر دەبێت.

ئەو کەسەش کە لێرەدا باسی ژیاننامەی دەکرێت، یەکێکە لە بەناوبانگترین ئەو بانگخواز و چاکسازانەی کە هەموان دەیناسن و، لەنێو موحازەرەکەشدا بۆ خوێنەر ئاشکرا دەبێت کە

نووسەرە ڕۆژهەڵاتیەکان چەند ستایشیان کردووە، بەڵکو یەکێك لە زاناکانی مەغریبیش کە بە (سید محمد بن الحسن الحجوي) دەناسرێت و، لە کۆڕێکیدا لە ( نادي الخطابة الأدبي) لە شاری (فاس) لە ربيع الثاني ساڵی 1336 ك باسی شێخی کردووە و، وتوویەتی:

( ابو عبد الله محمد بن عبد الوهاب الثميمي الجندي) لە هەرێمی (العارض) لە شاری عویەینە لە نەجد لە ساڵی 1115 ك لەدایك بووە، پاش پەروەردەبوونی لەبەردەستی باوکیدا ڕۆشت بەرەو بەصرە بۆ درێژەپێدان بەخوێندن و فێربوون و، لەوێیش کارامەیی پێوە دەبینرا لە زانستە ئاینیەکان و زمانی عەرەبی و، لە هاوڕێکانی ژیرتر و زیرەکتر بوو، هەروەها بەوەش دەناسرا کە لەخوا ترس و دیندارە و... ئینجا وتوویەتی:

بیروباوەڕی: لەسەر سوننەتی تەواوە، لەسەر ڕێڕەوەی سەلەف کە دەستیان گرتووە بە قورئان و سوننەتەوە و، خۆیان ناخەنە ناو فەلسەفە و ، بیروباوەڕیانی لێ دوور دەگرن.

لە (فروع)یشدا: لەسەر مەزهەبی ئەحمەدە و، توندڕەو نیە لە لاسایی کردنەوەی ئەو پێشەوایەدا، یان هیچ پێشەوایەکی تر، بەڵکو هەرکاتێك بەڵگەی بینیبێت کاری پێکردووە و، وازی لە وتەی مەزهەبەکان هێناوە، واتە: سەربەخۆیی بیرکردنەوەی هەیە لە بیروباوەڕ و مەسەلە فیقهیەکاندا، تاکو دەڵێت: پیاوێکی خاوەن کەسایەتی بەهێز بوو، کاریگەریشی لەسەر دڵ و دەروونی خەڵکی زۆر بوو، ئینجا فەرمانی بە چاکە دەکرد و، نەهیشی لە خراپە دەرکرد و، خاوەن کەسایەتیەکی تاك بوو لە نێو هۆزەکەی خۆیدا. ئێمەش ئەگەر چی ئەم چەند

دێڕە لە قسەی ئەو زانا مەغربیە باس دەكەین لەڕاستیدا جەخت لەسەر ئەوە دەكەینەوە كە بیریارن بایەخ بەژیاننامەی شێخ دەدەن و باسی پشوو درێژی دەكەن لە كاتی بانگەوازدا.

بەڵكو هەندێك لە دكتۆر (كامل الطويل) دەگێڕنەوە لەو ماوەی كە لە ئەورووپا بووە بۆ ئامادەكردنی نامەی دكتۆراكەی، چەند بەڵگەنامەیەكی دەستكەوتبوو كە ئاڵووگۆڕی پێ كراوە لەنێوان (ناپلیۆن) و (بابا)ی گاورەكان سەبارەت بە بانگەوازی شێخ موحەممەد، وتوویانە پێویستە كاری پێویست ئەنجام بدرێت سەبارەت بە ترسناكی ئەو بانگەوازە لەسەر بەرژەوەندییەكان لە ڕۆژهەڵات.

جا مادام مەسەلەكە وایە، هیچ نەبێت ژیاننامە و ڕێبازی بانگەوازی ئەم كەڵەپیاوە پێشكەش بكرێت بۆ خەلكی، بەتایبەتی بۆ تازە

پێگەیشتووەكان، بۆئەوەی ئەوەیان بۆ دەركەوێت تاچەند ئەو كەڵەپیاوە كۆششی كردووە و ئارامی لەسەر بانگەوازەكەی گرتووە تاكو سەركەوتنی بەدەست هێناوە.

ئەوەش كە دەبێتە مایەی گرنگی بۆ ئەم موحازەرەیەی (ابن باز) دوو هۆكارە:

یەكەم: هۆكارەكانی بانگەواز و بنەماكانی و، ڕێبازی بانگخواز و هەستیارییەكەی باس دەكات و، لایەنێكی هەرەگرنگ لە لایەنەكانی بیروباوەڕ ڕوون دەكاتەوە، كە بریتیە لە یەكتاپەرستی خواپەرستن كە خەڵكی پێویستی زۆریان پێیەتی، بەتایبەتی لەو شێوەی كە لە كۆڕەكەیدا شیكراوەتەوە.

دووەم: ئەم موحازەرە لەلایەن كەسێك وتراوەتەوە، كە لە خەڵكی تر لەپێشترە بۆ شێخ موحەممەد، چونكە خۆی یەكێكە لە زانایانی

نەجد و، یەکێکە لە دیارترین ئەو کەسانەی زانستی لە کوڕەزاکانی شێخ وەرگرتووە، بۆیە لەهەموو کەسێك نزیکترە لەو پێشەوایەوە، ئەو موحازەرەش لەڕاستیدا لەئەو پەڕی ڕیکوپێکیدایە و، ئامانجی خۆی پێکاوە سەبارەت بە باسکردنی شێخ و بانگەوازەکەی و، بارودۆخی خەڵکی لەو سەردەمە و، هۆکارەکانی درووست بوونی ئەو بانگەوازە و، سەرکەوتنی لە کۆتاییدا، خوای گەورە پاداشتی مامۆستای بەڕێز بداتەوە بۆ ئەو موحازەرەیە، درووود و سلاوی خوای گەورەش لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر بێت ﷺ، خوای گەورەش ڕازیبێت لەهەموو بانگخوازێك بۆ ئایینی ئیسلام و، هەوڵی هەموو چاکسازێك لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای زەویدا سەربخات، آمین و الحمد لله رب العالمین.

## کورتەیەك دەربارەی ژياننامەی (ابن باز) ڕەحمەتی خوای لێبێت:

ناوی: (عبدالعزيز بن عبد الله بن عبد لرحمن بن محمد بن عبد الله آل باز).

لەدايك بوونی: لەشاری ڕياز لە ژی الحجەی ساڵی 1330 ك – 1912 ز لەدايك بووە.

پەروەردەی: لەسەرەتای تەمەنييەوە دەستی كردووە بە فێربوونی زانست و، لە خێزانێكی بەڕێزی زانستپەروەردا گەورە بووە.

خوێندنی: پێش گەيشتن بە تەمەنی پێگەيشتن قورئانی لەبەر كرد و، هەروەها زانستە شەرعيەكانی لە زانايانی ڕياز وەرگرت.

مامۆستايانی: زانستی لە زۆر مامۆستا وەرگرتووە، زۆربەيان لە نەوەی شێخ موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب بوون، لەوانە: (محمد بن عبد اللطيف بن عبد الرحمن آل شيخ) و

(صالح بن عبد العزيز بن عبد الرحمن آل شيخ) و (سعد بن حمد آل عتيق) و (حمد بن فارس) و (محمد بن إبراهيم آل الشيخ) كه موفتى ولاّتى سعوديه بوو، كه زياتر له ده ساڵ وابەستەی ئەم مامۆستايەی بوو، زۆربەی زانستەكانيشى لەلا خوێند، بەم شێوەی كه دەيخەينە ڕوو:

بەيانيان لەپاش نوێژی بەيانی تا خۆرئاوا بوون له مزگەوتدا، پاشان له چێشتەنگا له كۆڕی شێخدا لەماڵی خۆی، پاش نوێژەكانی نيوەڕۆ و، عەسر و، مەغريبيش له مزگەوتدا.

شێخ (ابن باز) به يەكێك له گەوره زانايان و، موجاهيدانی ئەم سەردەمه دێته ئەژمار، چونكه خوای گەوره بەشێوەيەك زانستەكانی زمانی عەرەبی بۆ ئاسان كردن بەهۆيەوه توانی له هەموو زانستەكانی شەرعدا و بەتايبەتی لەسەر ڕێڕەوی پێشەوا ئەحمەد شارەزا بێت بەتەواوی،

ئینجا گرنگی زۆری دا بە زانستی فەرموودە و، لەڕووی سەنەد و مەتنەوە، هەروەها بایەخی زۆری دا بە زانستەکانی قورئانی پیرۆز.

شێخ (ابن باز) بۆ ماوەی (14) ساڵ قازی ناوچەی خەرج بوو، کە لەو ماوەیەدا نمونەی دادوەری لەخواترس بوو، زۆریش گرنگی دەدا بە کاروباری ناوچەکە و خەڵکەکەش بەشێوەیەکی گشتی.

دواتر کاری گواستەوە بۆ فێرکردن و وانە وتنەوە لە پەیمانگا و کۆلێژەکان، لەو کارەشدا هەر نمونە و پێشەنگێکی چاك بوو، دواتر بوو بە جێگری سەرۆکی زانکۆی ئیسلامی لە ساڵی 1381 ك، هاوکات موفتی وڵاتی سعودیەش بووتاکو لە دونیا دەرچوونی ساڵی 1999 ز، ڕەحمەتی خوای لێبێت.

نووسینەکانی: لەڕاستیدا سەرقاڵی زۆری شێخ (ابن باز) بواری بۆ نەڕەخساند دابڕێت بۆ نووسین و دانانی کتێب بەباشی، بەڵام لەپاش لەدونیا دەرچوونی فەتواکانی شێخ لە (5) بەرگدا کۆکرایەوە و چاپ کرا، ئەمەش هەندێکە لە نووسینەکانی شێخ[1] :

1. الفوائد الجليلة في المباحث الفرضية.
2. نقد القومية العربية.
3. توضيح المناسك.
4. رسالة في الشغار.
5. الجواب المفيد في حكم التصوير.
6. رسالة في التبرح و الحجاب.

جگە لە فەتواکانی کە زۆربەی بابەتەکانی زانستە ئیسلامیەکانی گرتووەتەوە.

---

[1] ئەمە کورتەی ژياننامەی شێخ (ابن باز)ە بە دەستکارییەوە لە شێخ (محمد عطية سالم)م وەرگرتووە. (وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله و خيرته من خلقه سيدنا و امامنا محمد بن عبدالله، وعلى آله و اصحابه ومن والاه.

برا بەڕێزەكانم، كوڕە خۆشەويستەكانم، ئەم وانە كورتەتان پێشكەش دەكەم وەكو ڕوون كردنەوەيەك بۆ بيرەكان و، دەرخستنێك بۆ ڕاستيەكان و، ئامۆژگاری بۆ بەندەكان و، وەكو بەجێهێنانيش بۆ هەندێ لەو مافانەی ئەو كەسەی وانەكەی لەسەر دەلێمەوە هەيەتی لەسەرمان، ناونيشانی ئەم وانەم بريتيە لە: ( پێشەوا موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب، بانگەواز و ژياننامەی).

چونكە ئاخاوتن دەربارەی چاكسازان و بانگخوازان و نوێخوازان و، باسكردنی سيفەتە جوانەكانيان و، كردەوە بەرزەكانيان و

شیكردنەوەی ژياننامەيان كە ئاماژەدەكات بۆ دڵسۆزيان و، ڕاستگۆييان لە بانگەواز و چاكسازيدا، چونكە دڵ و دەروون حەز لەو باسانە دەكەن و، هەموو خاوەن غيرەتێك لەسەر دينەكەی خۆشحاڵ دەبێت بەوەی گوێبيستی ئەو جۆرە باسانە بێت، بۆيە بە باشم زانی باسی پياوێكی مەزن و چاكخوازێكی گەورە و بانگخوازێكی بەغيرەتيان بۆ بكەم، ئەويش پێشەوا و تازەكەرەوەی ئيسلام لە دورگەی عەرەب لەسەدەی دوانزەی كۆچی پێشەوا موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهابی كوڕی سولەيمانی كوڕی عەلی تەميمی حەمبەلی نەجدی، لەڕاستيدا خەڵكی ئەم زانايەيان بەباشی دەناسی بەتايبەت زانا و سەرگەورە و ناودارەكانيان لە دورگەی عەرەب و دەرەوەشی، زۆر كتێبيش دەربارەی نووسراوە بە كورتی و بەدرێژی،

هەندێکیش بەتايبەت کتێبێکيان لەسەری داناوە تەنانەت ڕۆژهەڵاتناسەکان زۆرشتيان لەسەری نووسيوە، کەسانێکی تريش لەنێو نووسينەکانياندا دەربارەی چاکسازان باسيان کردووە، يان لە درێژايی باسە مێژووييەکاندا نووسەرە بەويژدانەکان بەوە ستايشيان کردووە کە چاکسازی گەورە و، (مجدد)ی ئيسلام بووە، ناوهێنانی هەموو ئەو دانەرانەش کارێکی گرانە، بەڵام يەکێك لەوانە نووسەری گەورە ( ابو بکر الشيخ حسين بن غنام الاحسائي)يە، کە دەربارەی شێخ نووسيويەتی، بەجوانی و بە ڕوونی باسی بانگەواز و ژياننامە و شەڕەکانی کردووە،درێژەی بەو باسانە داوە و، زۆرێکی لە نووسين و هەڵێنجانەکانی شێخی بە ڕوو خستووە، يەکێکی تريش لەوانە (عثمان بن بشر)ە لە کتێبی (عنوان المجد) ئەويش هەر لە

زۆر ڕووەوە باسی شێخی کردووە، **هەروەها** لە دەرەوەی دورگەی عەرەب دکتۆر (أحمد أمين) لە کتێبی (زعماء الأصلاح) بە دادگەرانە باسی لە شێخ کردووە، یەکێکی تریش لەوانە مامۆستای گەورە (مسعود الندوي)یە، شێخی بە چاکسازی ستەم لێکراو ناوبردووە، زۆر بە جوانیش دەربارەی ژیانی ئەو پیاوە نوسیوێتی، **هەروەها** یەکێکی تر لەوانەی لەسەردەمی شێخدا ژیاون و لەسەر بانگەوازەکەیان نووسیوە (الأمير محمد بن اسماعيل الصنعاني)ە، کە زۆر خۆشحاڵ بوو بە بانگەوازەکەی شێخ و سوپاسی خوای گەورەی لەسەر ئەوە دەکرد، بە**هە**مان شێوە زانای گەورە (محمد بن علي الشوكاني) خاوەنی کتێبی (نيل الاوطار) لەسەر شێخ (محمد بن عبدالوهاب) نووسینی بووە و، بەبۆنەی مردنیشیەوە **هۆ**نراوەی کاریگەری نووسیوە، جگە لەمانەش

مامۆستا و نووسەرانی زۆری تریش دەربارەی شێخ شتیان نووسیوە، خوێنەران و زانایان ئەو نووسەرە دەناسن[1]، بەهۆی ئەوەشەوە کە زۆرێك لە خەڵکی زانیاری تەواو نازانن دەربارەی ئەم پیاوە، بەباشم زانی بەشداری بکەم لە ناساندن و دەرخستنی کارەجوانەکانی لە بانگەواز و جیهادی ڕاستەقینە، هەروەها هەندێ لێکدانەوە بکەم لەو شتانەی کە دەیزانم دەربارەی ئەم پێشەوایە، بۆئەوەی ببێتە بەرچاو ڕوونی بۆ ئەو کەسەی کە گومانێکی لەلا درووست بووە، سەبارەت بە ژیان و بانگەوازی.

---

[1] یەکێکە لەوانەش کە نووسینیان کاریگەری خۆی بووە دەربارەی شێخ (سيدي محمد بن الحسن الحجوي الثعالبي)ە، گرنگریشی لەوەدایە گە ئەو کۆمەڵە وانە لە (نادی الحبانیه الادبی) وتراوەتەوە لە شاری فاس لە ساڵی 1336 ك، دواتریش بوو بە بابەتێکی ئەکادیمی.

بۆچوونی پەسەند دەربارەی لەدایك بوونی ئەم پێشەوایە ئەوەیە کە لە ساڵی (1115 ك) (1704 ز) لەدایك بووە، بۆچوونێکی تر هەیە کە لە ساڵی (1111 ك) لەدایك بووە، بەڵام بۆچوونی یەکەم ڕاست ترە، لە عویەینە کە شوێنی لەدایکبوونێتی لەسەر دەستی باوکی فێری زانستەکان بوو، عویەینە ناوچەیەکە لە یەمامە لە نەجد کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای شاری ڕیاز بە دووری حەفتا کیلۆمەتر، بەشێوەیەکی باش لەوێ پەروەردە بوو و هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە قورئانی خوێند و کۆششی دەکرد بۆ تێگەیشتن و فێربوون لەلای باوکی کە زانا و شەرع ناسێکی گەورە بووە[1]، هەروەها قازی ئەو ناوچەیەش بووە، لە سەرەتای تەمەنی

[1] ژياننامەی باس کراوە لە کتێبی الفكر السامي بە ژمارە (1007) لاپەڕە (195) بەشی چوار.

لاوێتی حەجی کردووە و، چووە لای هەندێ لە زانایانی حەرەمی پرۆزی مەککە، ئینجا ڕویکردە مەدینە سەڵات و سەلامی خوا لەسەر جێنشینەکەی بێت، لەوێ لەگەڵ زاناکاندا کۆبوویەوە و، بۆ ماوەیەك تێیدا مایەوە و، زانستیشی لە دوو زانای بەناوبانگی گەورەی ئەو سەردەمی مەدینە وەرگرت، کە بریتی بوو لە عەبدوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی سەیفی نەجدی، کە باوکی دانەری کتێبی (العذب الفائض في علم الفرائض) بوو، هەروەها زانستی وەرگرت لە مامۆستای گەورە (محمد حياة السندي) لە شاری مەدینە، لەوانەشە لە زانای تریش زانستی وەرگرتبێت کە ئیمە نەزانین.

ئینجا ڕویکردە عێراق بۆ فێربوونی زانست، سەرەتا چووە بەصرە لەگەڵ زاناکاندا کۆبوویەوە و زانستی لێوەرگرتن، لەوێیش بە ئاشکرایی

بانگەوازی دەکرد بۆ یەکتاپەرستی و خەڵکی بۆ کارکردن بە سوننەت بانگ دەکرد.

بۆ موسوڵمانان ڕوونیشی کردەوە کە پێویستە لەسەریان ئایینیان لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ وەربگرن، لەم بارەشەوە وتووێژ و قسەوباسی لەگەڵ زاناکانی ئەو ناوچەیە ئەنجامدا، یەکێك لە مامۆستاکانی لەوێ ناوی (محمد المجموعي) بوو، خەڵکی لە دژی هەڵسان و، ئازاری ئەو و (شێخ محمد عبدالوهاب)یشیاندا، بۆیە بڕیاری دا ڕوو بکاتە شام، بەڵام بەهۆی کەم درامەتیەوە نەیتوانی، بۆیە لە بەصرەوە بەرەو زوبەیر و لەوێیشەوە ڕۆشت بۆ (احساء) و لەگەڵ زاناکاندا لەوێ کۆبوویەوە و دەربارەی هەندێك لە مەسەلەکانی (اصول الدين) تووێژی کرد، ئینجا بەرێکەوت بەرەو ناوچەی (حريملا) لە پەنجاکانی سەدەی دوانزەیەمدا، چونکە باوکی قازی

عویەینە بوو، لەگەڵ فەرمانڕەواکەشیدا هەندێ ناکۆکی کەوتبووە نێوانیان، بۆیە ڕۆشت بۆ (حریملا) لەساڵی (1139 ك) جا شێخ موحەممەد چووە لای باوکی لەوێ بۆیە پێدەچێت لەساڵی (1140) گەیشتبێتە (حریملا)، یان کەمێك پاش ئەو ساڵە، لەوێ نیشتەجێ بوو و سەرقاڵی زانست و فێرکردن و بانگەواز بوو تاکو لە دونیا دەرچوونی باوکی لە ساڵی (1153 ك)، لەوکاتە ڕووبەڕووی هەندێك خراپە و دەست درێژیی بوو لەلایەن کەسانێك لە دانشتوانی ئەو ناوچەیە، دەڵێنیش هەندێ لەوانە ویستیان بیکوژن... پاشان شێخ کۆچی کرد بەرەو ناوچەی عویەینە، هۆکاری هەڵچوونی ئەو خەڵکە نادانانەش لە دژی شێخ ئەوە بوو کە فەرمانی بە چاکە دەکرد و نەهی لە خراپە دەکرد و، بەرپرسانی هاندەدا کە سزای تاوانباران بدەن کە

دەست درێژی دەکەنەسەر خەڵکیدا بە دزی و تالآنی و ئازاردان، جا تاقمێکی خراپەکار بوو بە کۆیلەکان (العبید) دەناسران لەویٚ، کاتێك کە زانییان شێخ لە دژیانە و بە کردەوەکانیان ڕازی نابێت و، هانی بەرپرسان لە دژیان دەدات، بۆیە ئەوانە ویستیان شێخ موحەممەد بکوژن، بەڵام خوای گەورە پاراستی و ڕۆیشت بەرەو دەڤەری عویەینە، کە سەرۆکەکەی لەو سەردەمە (عثمان بن محمد بن معمر) بوو، لە ڕاستیدا پێشوازی گەرمی لێکرد و میوانداری کرد، پێیشی وت: هەڵسە و بانگەواز بکە بۆ لای خوای گەورە و ئێمەش لەگەڵتداین وکۆمەکیت دەکەین، بۆیە شێخ دەستی کردە ئامۆژگاری کردن و فێرکردنی خەڵکی و ناوبانگی پەیداکرد لەو دەڤەرە و، خەڵکی لە گوندەکانی دەورووبەرەوە دەهاتنە لای.

ڕۆژێك شێخ بە سەرۆکی عویەینەی وت: وەرە با گومەزی گۆڕەکەی زەیدی کوڕی خەتتاب بڕوخێنین ڕەزای خوای لێبێت، چونکە خوای گەورە ڕازی نابێت بەوەی کە خەڵکی دەیکەن لە دەوری ئەو گۆڕە، پێغەمبەری خوایش ﷺ درووست کردنی هەموو بونیادێکی لەسەر گۆڕ قەدەغە کردووە، هەروەها قەدەغەشی کردووە کە مزگەوتیان لەسەر درووست بکرێت، ئەو گومەزەش بیروباوەڕی خەڵکی تێکداوە و، بووەتە مایەی هاوەڵ بۆ خوا دانان، بۆیە پێویستە بڕوخێنرێت، سەرۆکی عویەینە وتی: من دەترسم خەڵکی گوندی جوبەیلە کە نزیك گۆڕەکەن، هەڵچن و بەو کارە ڕازی نەبن، ئیتر فەرمانڕەوا عوسمان و شێخ موحەممەد لەگەڵ شەش سەد چەکدار دەرچوون بە مەبەستی ڕوخاندنی گومەزەکە.

کاتێك نزیك بوونەوە، خەڵکی ئەو گوندە دەرچوون بۆ بەرگری کردن لە گومەزەکە، بەڵام کاتێك سوپاکەیان بینی پاشگەز بوونەوە، شێخ و ئەوانەی لەگەڵی بوون دەستیان کردە ڕووخاندنی گومەزەکە و، خوای گەورە ئەو کارە چاکەی لە سەر دەستی شێخ (محمد بن عبدالوهاب) بە ئەنجام گەیان.

جا با ئێستا کورتەیەك دەربارەی نەجد پێش هاتنی شێخ باس بکەین هەروەها باسی هۆکاری بانگەواز کردنی شێخ بکەین لەوێ.

خەلکی نەجد لەپێش هاتنی شێخ لە حاڵەتێکە خراپدا بوون کە هیچ ئیماندارێك بەو حاڵە ڕازی نابێت، شیرکی گەورەیان تێدا پەیدا بوو و بڵاوەشی کردبوو، تەنانەت گومەز و دار و بەرد و شتی تر دەپەرستران، هەروەها کەسانێك بەناو ئەولیا،کە لە بنچینەدا شێت و گەمژە بوون

دەپەرستران، ئینجا جادووگەر و فالّچی لەو ناوچەیە تەشەنەیان کردبوو، پرسیاریان لێدەکرا و، کەسیش نکۆڵی لەو بارودۆخە ناڕەوایە نەدەکرد، خەڵکی بەگشتی بایەخدانیان بە دونیاوە بەسەر زاڵ بوو، بە دەگمەنیش دەبینرا کەسێك پشتگیری ئاینی خوا بکات، بەهەمان شێوە لە هەردوو حەرەمی پیرۆزدا و لە یەمەن، شیرك و بونیاد لەسەر گۆڕ درووست کردن بڵاو بوویەوە، هاوار بە ئەولیا دەکرا، لە یەمەنیش لەم چەشنە کارانە زۆر بوون، هەروەها لە ناوچەکانی نەجد قەبر و ئەشکەوت و دار و درەخت و شێت و ناتەواو هەموو ئەوانە بە پیرۆز دادەنران و هاواریان پێ دەکرا، بە هەمان شێوە بە نەجددا هاوارکردن بە جنۆکە و داواکردنی یارمەتی لێیان و قوربانی کردن بۆیان و شتی لەو جۆرە تەشەنەی کردبوو.

کاتێك شێخ (محمد بن عبدالوهاب) هەموو ئەو تاوانانەی بینی بەو شێوە لەناو خەڵکیدا بڵاوەی کردووە و کەسیش نیە لە دژی ڕاوەستێ، بڕیاریدا ئارام بگرێت لەسەر بانگەواز کردن و دەست بکات بە جیهاد کردن، بۆیە کۆششی کرد لە فێر کردن و ئامۆژگاری کردنی خەڵکی لەو ماوەی کە لە عویەینە بوو، نامەی بۆ زانایان دەنووسی و قسەی لەگەڵ دەرکردن، بە ئومێدی ئەوەی پشتگیری لێ بکەن و، لەدژی ئەو شیرك و کارە پڕوپووچانە ڕاوەستن، زۆرێکیش لەو زانایانە بەدەنگی بانگەوازەکەی شێخ موحەممەدەوە هاتن لە زانایانی هەردوو حەرەمی پیرۆز و، یەمەن و شوێنانی تر، بەڵام هەندێکی تر ناڕەزاییان دەربڕی و، دەستیان کرد بە ناشیرین کردنی شێخ و ناوزڕاندنی، ئەوانەش نەفام بوون و لەئایینی خوا و بێئاگا بوون، تەنها ئەوەیان دەزانی کە

باوباپیریان لەسەری بوونە لە نەفامی و گومڕایی و شیرك و بیدعە و، شتی بیٚ بنچینە، وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ( ﭙ ﭚ ﭛ ﭜ ﭝ ﭞ ﭟ ﭠ ).

دەستەیەكی تریش هەبوون كە گوایە زانا بوون بەرپەرچی شێخیان دەدایەوە و لەڕووی ڕادەوەستان لەڕووی سەركەشی و ئیرەییەوە، نەوەك خەڵكی عەوام بڵێن: ئەوە ئێوە پێشتر بۆچی لەم شتانە وریاتان نەدەكردینەوە؟! بۆچی كوڕی (عبدالوهاب) شتێكی ڕاست و ڕەوای هێنا و، ئێوەش زانان و، ئەو ناهەقەتان پێڕانەدەگەیاندین؟ ئەوانیش ئیرەییان دەبرد و شەرمیان كرد لە عەوامی خەڵكی، بۆیە لەڕووی شێخ ڕاوەستان و، شتی هەنووكەییان بەسەر دواخراودا هەڵبژارد، لەوەشدا شوێنكەوتووی

جوولەکەکان بوون کە دونیایان هەڵبژاردە سەر دوارۆژدا، خوای گەورە سەلامەتمان بکات.
بەڵام شێخ ئارامی گرت و کۆششی کرد لە بانگەواز کردن و، هەندێ لە زانا و ناودارانی لە ناوخۆی دورگەی عەرەب و دەرەوەی هانیان داو پشتگیرییان کرد، ئەویش بڕیاری خۆی داو پشتی بە پەروەردگاری خۆی بەست، دەستی کرد بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی کتێبی بە سوود، پێش ئەوانەش بایەخی زۆری دایە قورئان و، دەستێکی باڵای بوو لە لێکدانەوەی قورئانی پیرۆز و، حوکم وەرگرتن لە ئایەتەکانی و گرنگی زۆریدا بە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ڕزای خوایان لێبێت، لەو بارەوە زۆر کۆششی دەکرد و ورد دەبوویەوە و، بە پشوویەکی درێژەوە کاری دەکرد و، سوور بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی لە نێوان خەڵکیدا و،

نامەی بۆ زاناو سەرکردەکان دەنووسی لەو بارەوە، بۆیە خوای گەورە ئاواتە چاکەکانی بۆ بەدی هێنا و، ئەوی کرد بە هۆکارێك بۆ بڵاوبوونەوەی بانگەواز و، هەق و ڕاستی پێ جێگیر کرد و، کەسانێکی بۆ ڕەخساند یارمەتیان دا لە ئەرك و کارەکانی و، مەسەلەکەی بەهەموو لایەکدا بڵاوبوویەوە، شێخ لە بانگەوازەکەیدا هەر بەردەوام بوو لە عویەینە، پاشان بڕیاری دا دەست بکات بە جێبەجێکردنی هەنگاوی کردەیی و، شوێنەوارەکانی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان لەنێو بەرێت، بۆیە بەدەستی خۆی و بەگوێرەی توانا دەستی کردە جێبەجێکردنی ئەو کارە.

شێخ بە فەرمانڕەوا (عثمان بن معمر)ی وت: پێویستە ئەو گومەزەی سەر گۆڕەکەی زەید بڕوخێنین، زەیدی کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت برای عومەری کوڕی خەتتابە ڕەزای خوای

لێبێت، یەکێکیش بوو لەو شەهیدانەی کە لە جەنگی دژی موسەیلەمەی درۆزندا شەهید بوو لەساڵی (12 ك)، جا هەر لەو جێگەی تێیدا کوژرا ئەو گومەزە لەسەر گۆڕەکەی درووست کرا، وەکو دەگێڕنەوە لەوانەشە گۆڕی کەسێکی تر بێت، هەرچۆنێك بێت ئەو فەرمانڕەوایە پشتگیری لە شێخ کرد و، گومەزەکە ڕوخێنرا و، هەندێ گۆڕی تریش هەبوو لەوانە گۆڕی (ضرار بن الأزور) کە ئەویش گومەزێکی لەسەر بوو، ئەویش بەهەمان شێوە ڕووخێنرا و، خوای گەورە لەنێوی برد، هەروەها دار و درەخت و شتی تر بوو دەپەرسترا،بۆیە لەنێو بران و خەڵکی لێ وریا کرانەوە.

مەبەستمان لەوەیە بڵێین شێخ ڕەحمەتی خوای لێبێت بەردەوام بوو لە بانگەوازەکەیدا لە گوفتار و کردار، پاشان ئافرەتێك هاتەلای و، دانیدا

بەوەی کە داوێن پیسی ئەنجام داوە، دانپێدانەکەشی چەندجار دووپات کردەوە، شێخ پرسیاری ئەقڵ و هۆشی ئەو ئافرەتەی کرد، وتیان لەو بارەوە کێشەی نیە، کاتێك بینی سوورە لەسەر دان پێدانانەکەی و، بینی کە شوویشی کردووە، فەرمانی کرد کە بەردباران بکرێت، کە خۆی لەو کاتەدا قازی عویەینە بوو، دوای ڕووخاندنی گومەزەکان و ڕەجم کردنی ئەو ئافرەتە و، هەروەها بانگەوازی بۆ ئایینی خوای گەورە ناوبانگی دەرکرد و، باسەکەی گەیشتە فەرمانڕەوای (الاحساء) و دەوروبەرەکانی لە (بني خالد سليمان بن عريعر الخالدي) ئەوان ترسان ئەم ناودەرکردووە مەسەلەکەی تاکو بێت گەورەتر بێتەوە، بۆیە نامەی نووسی بۆ عوسمانی سەرکردەی عویەینە کە شێخ موحەممەد بکوژێت و پێی وت: یان دەبێت (محمد

بن عبدالوهاب) بکوژیت، یان ئەو خەرجیەت کە لە ئێمەی وەردەگریت لێت دەبڕینەوە!! ئەو مەسەلەیەش زۆر ناخۆش بوو بەلای عوسمانەوە، چونکە داهاتێکی ئاڵتوونی لێ وەردەگرت و، ترسا ئەگەر بە قسەی نەکات ئەو داهاتەی لێ ببڕێتەوە، یان جەنگ لە دژی بەرپا بکات، عوسمان بە شێخ موحەمەدی وت: ئەو فەرمانڕەوایە ئەمەوئەوەی بۆ نووسیم، بێگومان ئێمەش ئەو کارە ناکەین تۆ بکوژین، بەڵام لەو فەرمانڕەوایە دەترسین و توانای لەڕوو وەستانیمان نیە، جا ئەگەر لەم ناوچە دەرچووبایەیت چاکتر بوو، من بانگەواز بۆ ئایینی خوا دەکەم و، دەمەوێت (لا اله الا الله محمد رسول الله) بێتە دی، جا هەرکێ دەست بەم ئایینەوە بگرێت و پشتگیری لێ بکان و باوەڕی پێ بهێنێ، خوای گەورە سەری دەخات و وڵاتی دوژمنەکانیشی پێ دەسپێرێت، بەڵام ئەو

فەرمانڕەوایە وتی: ئەی شێخ موحەممەد ئێمە توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ئەومان نیە و، ناتوانین لە قسەی دەرچین، بۆیە شێخ دەرچوو لە عویەینە بەرەو دەڤەری (الدرعية)، كە دەگێڕنەوە بە پیادە ڕۆیشت و لەكۆتایی ئەو ڕۆژەدا گەیشتە ئەوێ، چونكە عوسمان هیچ وڵاخێكی پێنەدا لەسەری ئەو گەشتە بكات، لەوێ بوو بە میوانی یەكێك لە پیاوچاكەكانی درعیە كە (محمد بن سويلم العريني) پێ دەوترا، دەشگێڕنەوە كە ئەو پیاوە زۆر ترسا لە هاتنی شێخ بۆ ماڵیان و سەر زەوی لێ تەنگ بوو، چونكە لە (محمد بن سعود) فەرمانڕەوای درعیە دەترسا، بەڵام شێخ موحەممەد پێی فەرموو مژدەت لێبێت و مەترسە، ئەوەی من بانگی خەڵكی بۆ دەكەم ئایینی خوایە و، خوای گەورەش ئایینی خۆی دەردەخات، ئینجا هەواڵی شێخ موحەممەد گەیشتە سەرۆكی

درعیە و، دەگێڕنەوە لەڕێگەی خێزانەكەیەوە ئەو هەواڵەی زانی، چونكە پیاوێكی خواناس چووبووە لای و هانی دا بوو كە باسی (محمد بن عبدالوهاب)ی بۆ بكات و قایلی بكات بە پشتگیری كردنی، ئەو ئافرەتەش ئافرەتێكی خواناس و چاكەكار بوو، كاتێك موحەممەدی كوڕی سعود چووە لای خێزانەكەی پێی وت: مژدەت لێبێت بۆ ئەو دەستكەوتە گەورەیە، ئەوە دەستكەوتێكە خوای گەورە بۆی ناردووی بانگخوازێك بۆ ئایینی خوا بانگەواز بكات، بەڕاستی ئەوە دەستكەوتێكی مەزنە، پەلە بكە لە پشتگیری كردنی و هەرگیز لەو كارە دوودڵ مەبە، سەرۆكی درعیەش ئەو بۆچوونەی لە خێزانەكەی وەرگرت، دەگێڕنەوە كە هەر خێزانەكەی بوو لەگەڵ چەند خواناسێك پێیان وت: ناگونجێت ئەو بانگ بكەیتە لای خۆت، بەڵام جوانترە خۆت بچیتە لای و،

زانست و ئەو کەسەش کە بانگەوازی بۆ دەکات مەزن ڕاگریت، ئەویش بەو بۆچوونە قایل بوو و، ڕۆیشت بۆلای شێخ لەماڵ (محمد بن سويلم) و، سڵاوی لێکرد و قسە وگفتووگۆی لەگەڵ کرد، پێی وت: ئەی شێخ موحەمەد موژدەت لێبێت بەوەی کە پشتگیریت دەکەم و، لە ئاسایش و بێترسیدا دەبیت لەلام، شێخیش پێی وت: مژە لەتۆش بێت بەسەرکەوتن و بە دەسەڵات بوون و سەلامەتی، ئەوە ئایینی خوایە، هەرکێ سەری بخات سەردەکەوێت و، هەرکێ پشتگیری لێبکات خوای گەورەش پشتگیری لێدەکات و، شوێنەواری ئەو کارەت (انشاءالله) بەزوویی دەبینیتەوە.

وتی ئەی شێخ من لەسەر ئایینی خوا و پێغەمبەر ﷺ جیهاد کردن لەپێناوی خوای گەورە بەیعەتت پێ دەدەم، بەڵام ئەترسم ئەگەر ئێمە پیشتگیریتمان کرد و سەرمانخستیت و

سەرکەوتیتە سەر دوژمنەکانتدا، بچیتە شوێن و خاکێکی تر، وتی: لەسەر ئەوە بەیعەتت لێ وەرناگرم، بەڵکو بەیعەت لەسەر خوێن و ڕووخاندن دەبێت، هەرگیز لەم ناوچەیە دەرناچم، ئیتر ئەویش بەیعەتی پێ دا لەسەر سەرخستن و لەسەر ئەوەی لە درعیە بمێنێتەوە و، یارمەتی سەرۆکی درعیە بدات و جیهاتی لەگەڵ بکات و تاکو خوای گەورە سەری دەخات.

ئینجا خەڵکی لەهەموو لایەکەوە دەهاتن بەرەو درعیە، لە عویەینە و، عەرقە و، مەنفوحە و، ڕیاز و شوێنی تر، درعیە بوو بە کۆچگایەك خەڵکی لەهەموو لایەکەوە بۆی دەهاتن، باسی شێخ موحەممەد لە هەموو دەڤەرەکان بڵاوەی کرد کە خەریکی بانگەواز و وانە وتنەوەیە. بۆیە خەڵکی بەتاك و بەکۆ دەهاتنە لای شێخ و، ئەویش بەئەوپەڕی ڕێزداری و شکۆمەندیەوە لە درعیە

بوو، وانەکانی ڕێك دەخست و لە (عقائد) و قوئانی پیرۆز و، تەفسیر و، شەرع و، ئوصول و، فەرمووودە و، زاراوە و، زانستەکانی عەرەبی و، مێژوو و شتی تر، خەڵکی لەهەموو لایەکەوە دەهاتنە لای و، لاوان و کەسانی تریش زانستی لێ فێردەبوون.

وانە و کۆڕی بوو بۆ خەڵکی عەوام و خەڵکی تایبەتیش، ئینجا دەستی کرد بە جیهاد کردن و نامەی بۆ خەڵکانێك نووسی بۆئەوەی بێنە ئەم گۆڕەپانە و شیرك لە وڵاتەکەیاندا لەناو ببەن، لەسەرەتایشەوە بە خەڵکی نەجد دەستی پێکرد و، نووسراوی ئاراستەی زاناو فەرمانڕەواکانی کرد، هەروەها نامەی نووسی بۆ زانایانی باشوور و، قەصیم و، هایل و، وەشم و، سەدیر و شوێنی تر، بەهەمان شێوە نووسراوی نارد بۆ زانایانی (الاحساء) و هەردوو حەرەمی مەککە و مەدینە و،

زانایان لە میسر و شام و عێراق هیندستان و یەمەن و شوێنی تر، هەر بەردەوامیش بوو لەسەر بەڵگە هێنانەوە و، ئامۆژگاری کردنی خەڵکی لەو کارانەی کە تێکەوتبوون لە شیرك و بیدعە، ئەوەش واتای ئەوە نیە کە کەس نەبوو پشتگیری ئایینی خوا بکات، چونکە خوای گەورە ئایینی خۆی سەردەخات و، هەمیشەش دەستەیەك هەن لەم ئوممەتە کە لەسەر هەق و ڕاستین و خوای گەورەش سەریان دەخات وەکو لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هاتووە، لە زۆرێك لە وڵاتەکان دڵسۆز و هەڵگری ئیسلام هەبوو، بەڵام باسەکەمان لێرەدا تایبەتە بە ناوچەی نەجد کە شەڕ و خراپە و شیرك و بیدعەی ئەوەندە تێدابوو کە تەنها خوای گەورە ئەژماری دەزانێت، ئەمە لەکاتێکدا بوو زانای چاکیشی تێدا بوو، بەڵام خوای گەورە بۆی نەنووسیبوون کە بە باشترین

شێوە بەو بانگەوازە هەڵسن، هەروەها لە یەمەن و شوێنی تریش بانگەواز هەبوون بۆ ڕێگەی ڕاستی لەلام لەبەر چەند هۆیەك ئەو سەرکەوتنەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابیان بەدەست نەهێنا، لەوانە:

- نەڕەخساندنی یارمەتیدەرێکی باش بۆ ئەو زانایە.
- ئارام نەگرتنی ئەو کەسانە لەسەر ئازار و ناڕەحەتی، بانگەواز کردن بۆ دینی خوا.
- کەمیی زانست کە توانای ئاراستەکردنی خەڵکیان هەبێت بە شێوازی جوان و گونجاو و، ئامۆژگاریکردنیان بە وشە و بڕگەی شیاو.
- هۆکاری تریش هەبوون.

ئینجا بەهۆی ئەو هەموو ئاڵوگۆڕ کردنی نامە و جیهادەوە کە باسمان کرد، ناوبانگی شێخ بە

هەموو لایەكدا بڵاوەی كرد، بانگەوازەكەشی ناسرا و، نامەكانیشی گەیشتە دەستی زانایان لە ناوخۆ و دەرەوەی دورگەی عەرەب، خەڵكانێكی زۆریش لە هیندستان و، ئەندەنوسیا و، ئەفغانستان و، ئەفریقا و، مەغریب و، میسر و، شام و، عێراق كاریگەر بوون بەم بانگەوازەی شێخ موحەممەد.

كەسانێكی زۆریش هەبوون بانگەوازیان دەكرد بۆ ئایینی خوای گەورە، جا كاتێ باسی شێخیان پێگەیشت چالاكتر و بەهێزتر بوونەوە و، ناوبانگیان دەركرد.

لەم ڕۆژگارەی دواییشدا كتێب و نامیلكە و ژياننامەی شێخ موحەممەد چاپكران، بەشێوەیەك كە لە زۆربەی وڵاتەكاندا ناسرا، بێگومان هەموو نیعمەتێكیش كەسێك هەیە حەسوودی پێ ببات، هەموو بانگەوازێكیش ناحەزی زۆری هەیە، وەكو

خوای گەورە دەفەرموێت: (ڈ ڤ ڤ ڨ ڨ ڦ ڦ ڤ ڤ ج ج ڃ ڃ ڃ ڃ ڄڃ ڃ ڇ ڇ ڇ ڇڇ ڇ ڇ ڇ) بۆیە پاش ئەم ناودەرکردنەی شێخ زۆرێك لە ناحەزان و دوژمنانی شێخ دەرکەوتن و، بوونیش بە دوو بەشەوە: بەشێکیان بەناوی زانست و ئایینەوە دژایەتییان دەکرد، بەشێکیشیان بەناو سیاسەتەوە، بەڵام لەژێر پەردەی زانستدا خۆیان حەشار دابوو، ئەو هەلەشیان قۆستبوویەوە کە هەندێك لەو زانایانە دژ بە شێخ بوون و، دەیانووت لەسەر هەق نیە و...هتد

لەو کاتەشدا شێخ هەر بەردەوام لە بانگەواز و، ڕەواندنەوەی گومان و، ڕوونکردنەوەی بەڵگە و، ڕێپیشاندانی خەڵکی بۆ ڕاستییەکان بوو بەو شێوەی کە لە قورئان و سوننەتدا باس کراون، جاری واشبوو دەیانووت شێخ لە خەواریجەکانە،

یان دەیانووت لە یەکدەنگی موسوڵمانان لایداوە و، خۆی بە موجتەهید دەزانێت و، گوێ بە زانایانی پاش خۆی نادات، تۆمەتی تریش دەدرایە پاڵی، ئەوەش بەهۆی کەم زانستی بوو، دەستەیەکی تریش دژایەتیان دەکرد بەهۆی ترسانیان لە لەنێوچوونی پلەوپایەکانیان.

ناحەزانیش لەڕاستیدا دەبنە سێ بەشەوە:

- هەندێ زانای سەرلێشێواو کە هەق بە ناهەق دەبینن و، ناهەق بە هەق دەبینن و، باوەڕیان هەیە بە درووست کردنی بونیاد لەسەر گۆڕ و، درووست کردنی مزگەوت لەسەری و، هاوارپێکردن و شتی لەو شێوە.

واش دەزانن هەرکێ نکۆڵی لەو کارانە بکات ڕقی لە پیاوچاکانە و، دوژمنی ئەولیاکانە.

- هەندێکی تر هەن پێیان دەوترێت زانا، بەڵام نەیانتوانیوە شێخ موحەممەد بناسن، ئاگەداری ئەو هەقە بن کە پێی بوو، لەوەشدا ئەوان لاساییکەرەوەی کەسانی تر بوون لە گومڕاکان و، باوەڕیان بەوانە کرد گوایە (محمد بن عبدالوهاب) دژایەتی پیاوچاکان و ئەولیاکان دەکات و،یان نکۆڵی لە کەرامەتەکانیان دەکات، بۆیە ئەوانیش تانەو تەشەریان ئاراستەی شێخ کرد و، خەڵکیا لێ وریا دەکردەوە.
- بەشێکی تریش لە پلەوپایەی خۆیان دەترسان و دژایەتیان دەکرد، نەوەك دەستی لایەنگرانی بانگەوازی ئیسلامیان پێ بگات و، لە پلەوپایەکانیان بیانهێننە خوارەوە.

شەڕە قسە و مشت و مڕ هەر بە بەردەوامی مایەوە لەنێوان شێخ و ناحەزانیدا، نووسراویان ئاڵوگۆڕ دەکرد، ڕەخنەیان لێدەگرت و ئەویش بەرپەرچی دەدانەوە، تاکو کۆمەڵێکی زۆر لەو نامانە کۆکرایەوە و، لەچەندین جلّدا دواتر چاپکرا سوپاس بۆ خوا، شێخ هەر بەردەوام بوو لە بانگەوازکردن و جیهاد کردن، موحەممەدی کوڕی سعودیش کە سەرۆکی درعیە و، باپیری باپیرەی بنەماڵەی دەسەڵاتدارانی سعود بوو، هەر بەردەوام بوو لە یارمەتی دانی و، ئاڵای جیهادی هەر لە ساڵی 1158 ك بەرزکردەوە، جیهادی بە شمشێر دەست پێکرد، ئینجا بە قسە و ڕوونکردنەوە و بەڵگە، بانگەوازیش هەر بەردەوام بوو لەگەڵ جیهادی شمشێردا، ئاشکرایشە کە ئەگەر بانگخواز هێزێکی نەبێت کە هەقی پێ سەربخات و پێی جێبەجێ بکات ئەو بانگەوازەی

کپ دەبێتەوە، بێگومان چەك و هێزیش کاریگەری زۆری هەیە لە بڵاوکردنەوەی بانگەواز و سەرکوت کردنی نەیاران، پشتگیریکردنی هەق و، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ( ٻ ٻ ٻ پ پ ڀ ڀ ڀ ڀڀ ڀ ٺ ٺ ٺ ٺ ٿ ٿ ٹ ٹ ٹ ٹ ڈ ڈ ڤ ڤ ڦ ڦ ڦ).

خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە کە کە پێغەمبەرانی بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا ڕەوانە کردووە، بەمەبەستی دەرخستنی هەق و، پووچەڵ کردنەوەی ناهەق، هەروەها کتێبی لەگەڵ پێغەمبەراندا دابەزاندووە، کە ڕێنوێنی و ڕووناکی تێدایە و، دادگەریشی بۆ دابەزاندوون بۆئەوەی مافی زۆرلێکراو لە زۆردار وەربگرێتەوە و، هەقی پێ سەربخریت و، خەڵکیش لەژێر ڕۆشناییدا مامەڵە بکەن، هەروەها ئاسنی دابەزاندووە کە هێز و توندیەکی زۆری تێدایە بۆ

ئەو کەسانەی کە سەرپێچی لەڕێگەی ڕاستی دەکەن، ئاسن بۆ ئەو کەسەیە کە بەڵگە بێ سوودە لەگەڵیدا.

ئەوەیە چارەسەری بیماری هەموو نەفامێك، ئەوەشە چارەسەری دەردی کوشندە لەلایەن هەموو کەسێکی دادگەرەوە، کەسی هۆشمەند و خاوەن فیترەتی تەواو لە بەڵگە سوود وەردەگرێت و، هەق و ڕاستی قبووڵ دەکات، بەڵام کەسی ستەمکار کە شوێنکەوتووی ئارەزووی خۆیەتی، شمشێر نەبێت هیچ نایگرێتەوە، بۆیە شێخ موحەممەد چالاك بوویەوە لە بانگەواز و جیهاد کردن، لایەنگرانیشی لە بنەماڵەی سعود کۆمەکیان دەکرد، خوای گەورە گۆڕیان بۆ ڕووناك و بەرین بکاتەوە ئەوان لە ساڵی 1206ی کوچیەوە بەردەوام بوون لە جیهاد کردن تاکو نزیکەی پەنجا ساڵ، تا ئەو

کاتەی خەڵکی پابەند بوون بە گوێ ڕایەڵی یەوە و، چوونە ئایینی خوای گەورە و، گومەزەکانیان ڕووخاند و، ئەو مزگەوتانەش کە لەسەر گۆڕەکان درووست کرابوون لابران و، حوکمیان بە شەرعی خوا کرد و، وازیان هێنا لە حوکم کردن بە بۆچوونی باوباپیران و یاساوڕێساکانیان و، گەڕانەوە بۆ ڕێگەی ڕاست و، مزگەوتەکان بە نوێژ ئاوەدان کرانەوە و، بازنەکانی زانست فراوان بوویەوە و، زەکات دەردەکرا و، لە ڕەمەزاندا خەڵکی بەڕۆژوو دەبوون بەو شێوەی شەرعی خوا فەرمانی لەسەرە، هەروەها فەرمان بە چاکە و، قەدەغەکردنی خراپە پەیدابوو، ئاسایش و هێمنیش بەرقەرار بوو لەنێوان شار و لادێ و ڕێگەوبان و شوێنەکاندا، عەرەبە بیاباننشینەکانیش لە سنووری خۆیاندا ڕاوەستان و، شێخ بانگەوازی لەنێوانیاندا بڵاوکردەوە،

هەروەها هەڵسا بەناردنی مامۆستا و ڕێ پیشاندەر و دادوەر بۆ شار و بیابانەکان، لەپاش لە دونیا دەرچوونی شێخ موحەممەد ڕەحمەتی خوای لێبێت، کوڕ و کوڕەزا و قوتابیەکانی، هەروەها لایەنگرانی بانگەواز و جیهاد، لە سەرووی هەمووشیانەوە پێشەوا (عبدالعزیز بن محمد) و مامۆستایان (حسن بن محمد، علي بن محمد، ابراهیم بن محمد) لە کوڕەزاکانیشی مامۆستایان ( عبدالرحمن بن حسین، علی بن حسین، سلیمان بن عبدالله بن محمد) و، لە قوتابیەکانیشی مامۆستایان (حمد بن ناصر بن معمر) و، کەسانێکی زۆر لە زانایانی (الدرعیة) و کەسانی تر، هەر بەردەوانم بوون لە بانگەواز و جیهاد کردن و بڵاوکردنەوەی ئایینی خوای گەورە و، نووسینیان بڵاودەکردەوە و، جیهادی دوژمنانیان دەکرد، کە لە ڕاستیدا ئەو دوژمنانە

**هیچیان نەبوو لەدژی شێخ و لایەنگرانی جگە لەوەی کە بانگەواز دەکەن بۆ ڕەچاوکردنی تەواو بۆ ئایینی ئیسلام و، گومەز و مزگەوتی سەر گۆڕەکان دەڕووخێنن و، داوا دەکەن شەرعی خوای گەورە کاری پێ بکرێت و، سزاکان جێبەجێ دەکەن.**

**بەکورتی: ڕێنمایی خەڵکیان دەکرد بۆ یەکتاپەرستی خوای گەورە و، خەڵکیان وریا دەکردەوە لە شیرك و هەموو ڕێگەیەك کە ببێتە مایەی هاوبەش بۆ خوا دانان و، موسوڵمانیان وابەستە کرد بە کارکردن بە شەریعەتی خوای گەورە، هەرکەسێکیش لەسەر شیرك بەردەوام بووبایە و، گوێی بە ئامۆژگاری و ڕوون کردنەوە نەدایە ، جیهادیان لەدژی دەکرد و دەچوونە سەر خاك و وڵاتی تاکو دەگەڕایەوە سەر هەق، هەروەها خەڵکیان ئاگەدار دەکردەوە لە بیدعە و**

شتی بێ بنەما کە خوای گەورە فەرمانی پێ نەکردووە، وەکو بونیاد درووست کردن لەسەر گۆڕەکان و، گومەز بۆ دانانیان و، چوونە لای ئەو کەسانەی کە ستەمکار و تاغوتن و، یان پرسیار کردن لە جادووگەر و فاڵچی و کەسانی لەو شێوە، خوای گەورە هەموو ئەو شتە ناڕەوایانەی لەسەر دەستی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ڕەحمەتی خوای لێبێت لابرد .

مزگەوتەکان بە فێرکردنی قورئان و سوننەت و مێژووی ئیسلامی و زانستەکانی عەرەبی ئاوەدان کرانەوە، خەڵکی سەرقاڵ بووبوون بە زانست و بانگەواز و ئامۆژگاری، خەڵکانێکیش هاوکات خەریکی کاروباری خۆیان بوون لە کێڵگە و پیشەسازی و بازرگانی و شتی تر، جارێك بۆ ئایین و جارێك بۆ دونیا، بانگخواز بوون بۆ ڕێگەی خوا، بەڵام هاوکات سەرقاڵی جۆرەها پیشەسازی

بەسوود بوون لە ناوچەکانیاندا، لەو کارانەش درامەتی خۆبەڕێوە بردنیان دەست دەکەوێت کە ناچار نەبن بچنە دەرەوەی دەڤەرەکانیان، پاش ئەوەی بانگخوازان و ئال سعود کاری چاکەیان لە نەجد بەئەنجام گەیاند، دەستی خۆیانیان گەیاندە هەردوو حەرەمی پیرۆز و، باشووری دورگەی عەرەب و، نووسراویان نارد بۆ هەموو زانایانی مەککە و مەدینە، بەڵام کاتێك هەواڵەکان هیچ سوودیان نەبوو سەبارەت بە مەزنڕاگرتنی گومەز و مزگەوت دروست کردن لەسەر گۆڕەکان و، هاوبەش بۆ خوا بڕیاردان، بۆیە پێشەوا (سعود بن عبدالعزیز) پاش لەدونیا دەرچوونی شێخ موحەممەد بە یانزە ساڵ، ڕووی کردە دەڤەری حیجاز و لەگەڵ خەڵکی تائیف ڕووبەڕوو بوویەوە و، دواتر ڕووی کردە مەککە، جا ڕۆیشتنی سعود بۆ بۆ ناوچەی تائیف پێشتر فەرمانڕەوایەك

بەناوی (عثمان بن عبدالرحمن المضايفي) بەرەو ئەوێ ڕۆیشتبوو بە هێزێکەوە کە لەلایەن پێشەوا (سعود بن عبدالعزيز) ڕەوانە کرابوو، ئەو هێزە توانیان دەست بگرنە سەر تائیف و ئەو بەرپرسانەی کە لە لایەن شەریفەوە دانرابوون وەدەربنێن و، بانگەوازیان تێیدا ئاشکرا کرد بۆلای خوای گەورە و، ڕێنمایی کردن بۆ ڕێگەی ڕاست و، قەدەغە کردنی شیرك و، پەرستنی (ابن عباس) و کەسانی تر، کە نەفامەکانی ئەو ناوچەیە دەیانپەرستن و، ئینجا شازادە (سعود) بە فەرمانی (عبدالعزيز)ی باوکی بەرەو حیجاز بەڕێ کەوت و، هێز و سوپای زۆری لە دەوروبەری مەککە کۆکردەوە، کاتێك سەرگەورەی مەککە زانی ڕێگەچارەی نەماوە بەرەو جەددە هەڵهات.

(سعود) و ئەو موسوڵمانانەی کە لەگەڵی بوون، لە سپێدەی موحەڕڕەمی ساڵی 1218 ك چوونە

مەککە و، بانگەوازیان تێیدا بۆلای خوای گەورە ئاشکراکرد و، ئەو گومەزانە لەسەر گۆڕی خاتوو خەدیجە درووست کرابوو لایان برد و، هەموو گومەزەکانی تریشیان بە هەمان شێوە لابرد و مامۆستا و دادوەر و ڕێپیشاندەریان دیاری کرد لەوێ کە بە حوکمی شەریعەتی ئیسلام کاریان دەکرد، پاش ماوەیەکی کەم کە دووساڵی نەخایاند دەستیان گرتە سەر مەدینە و، ئال سعود بوونە فەرمانڕەوای ئەو شارە پیرۆزە، لەساڵی 1220 ك، هەردوو حەرەمی پیرۆزیش لەژێر چاودێری بنەماڵەی (سعود)دا بوون و، کەسانی چاکیان لەسەر کاروباری ئەو دوو شارە دیاری کردبوو، دادگەری کارکردنیان بە شەرع لەهەموو لایەکدا بڵاو کردەوە، هەروەها چاکەیان لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد بەتایبەت نەدار و هەژارەکانیان، ماڵیان پێ دەبەخشین و،

دڵنەواییان دەکرد و، فێری قورئانیان دەکردن و، ڕێگەی چاکەیان پێ پیشان دەدان و، ڕێزیان لە زانایان دەگرت و، هانی فێربوونی زانست و ڕێنوێنی خەڵکیان دەدا، ئەم دوو حەرەمە پیرۆزە تاکو ساڵی 1226 ك لە ژێر دەسەڵاتی ئال سعوددا بوو، ئینجا سوپاکانی میسر و تورکیا ڕوویانکردە حیجاز بەمەبەستی دەرکردنی ئەو دەسەڵاتە لە مەککە و مەدینە، ئەوەش لەبەر چەندین هۆکار،هەندێکیان باس کرد، بۆنمونە: دوژمن و کینە لە دڵەکانیان کە هیچ بەرچاوڕوونیەکیان نەبوو، هەروەها هەندێ لەو سیاسەتمەدارانەی کە ویستیان ئەو بانگەوازە لەنێو ببەن وترسیان لە پلەوپایەکانیان بوو، بۆیە درۆ و بوختانیان بۆ شێخ و شوێنکەوتوانیان هەڵدەبەست و، دەیانوت ئەوان ڕقیان لە پێغەمبەر ﷺ و ئەولیاکانە و، نکۆڵی دەکەن لە

کەرامەتەکانیان، هەروەها دەیانووت ئەوانە وا دەڵێن و وا دەڵێن سوکایەتی بە پێغەمبەران دەکەن دروودی خوایان لەسەر بێت، هەندێك لە نەفامەکانیش باوەڕیان بەو پڕۆپاگەندانە دەکرد و[1]، ئەوەیان دەکرد پەیژەیەك بۆ ناشیرین کردنیان و، هاندانی تورك و میسریەکان بۆ دژایەتی کردنیان[2]، بۆیە ئەو شەڕوشۆڕە بۆماوەی

---

[1] بۆنمونە هەڵی هاتنی حاجیانیان دەقۆستەوە و بۆ موککە و مەدینە و، ئەوانیان ناشیرین دەکرد بە پڕوپاگەندە و، دواتریش کە چاپەمەنی پەیدا بوو نامیلکە و کتێبیان بەهەموو لایەکدا بڵاودەکردەوە، بۆ ناشرینکردنیان لەبەردەم ڕای گشتیدا، یەکێك لەوانەش کە ناوبانگی بوو لە دژایەتی کردنیاندا، موفتی مەککە (أحمد بن زيني دجلان). (وەرگێڕ)

[2] بێگومان سەردەمانی کۆتایی حوکمی عوسمانیەکان لاوازییەکی زۆریان پێوە دیار بوو، ئەوانەش کە دانرابوون لەسەر وڵاتی میسر لەلایەن ئەوانەوە کەسانی خراپەکار و ئەڵقەلەگوێی دوژمنانی ئیسلام بوون جۆرێکیش لە سەربەخۆییان هەبوو بەسە بزانین کە شا (فۆاد) و (فاروق) لە نەوەی ئەوانن، بۆیە

حەوت ساڵ بەردەوام بوو لەنێوان سەربازە میسری وتورکیەکان و ئەوانەی لەگەڵیان بوون لەدژی ئال سعود لە نەجد و حیجاز.

پوختەی قسەکانیش ئەوەیە ئەم پێشەوایە کە موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابە ڕەحمەتی خوای لێبێت هەڵسا بۆ ڕوون کردنەوەی ئایینی خوای گەورە و، ڕێنوێنی کردنی خەڵکی بۆ یەکتاپەرستی خوای گەورە و، ڕەتکردنەوەی ئەو شتە تازانەی خەڵکی هێنابوویانە ناو ئایینەوە لە بیدعە و شتی بێ بنەما، هەروەها هەڵسا بۆ ئەوەی خەڵکی ناچار بکات بۆ وەرگرتنی هەق و، دوورکەوتنەوە لە ناهەق، فەرمانی بە چاکە پێکردن و، لە خراپەش نەهی لێکردن، ئەمەیە پوختەی بانگەوازەکەی شێخ ڕەحمەتی خوای

---

دژایەتی کردنی ئەو میسریانە هیچ سەیر نیە بۆ بانگەوازی شێخ (محمد بن عبدالوهاب). (وەرگێڕ)

لێبێت، ئەو لە مەسەلەی عەقیدە و بیروباوەڕدا لەسەر ڕێبازی سەلەفی چاکەکاری ئەم ئوممەتە بوو، باوەڕی هەبوو بە خوای گەورە و ناوەجوانەکان و سیفەتەکانی، هەروەها ئیمانی هەبوو بە مەلائیکە و پێغەمبەران و کتێبەکانی خوای گەورە و، ڕۆژی دوایی و، بە چاك و خراپی قەدەر... هتد، هەروەها لەسەر ڕێبازی پێشەوایانی ئیسلام بوو لە یەکتاپەرستی خوای گەورە و پەرستنی و، باوەڕهێنان بە ناو و سیفەتەکان کە شیاون بدرێتە پاڵی و، هیچ شیفەتێکی ڕەت نەکردەوە و، لێکچوونی نەدەکرد لەنێوان خوای گەورە و بەندەکانی، هەروەها لە مەسەلەی باوەڕ بە زیندوو بوونەوە و پاداشت و لێپرسینەوە و بەهەشت و دۆزەخ و شتەکانی تر، تێگەیشتنی وەکو تێگەیشتنی پێشەوایانی ئیسلام بوو، دەربارەی ئیمان دەقاودەق وەکو

پێشینانی چاكی ئەم ئوممەتە، دەیفەرموو: ئیمان زیاد و كەم دەكات، بە كاری چاكە زیاد دەكات و بەكاری خراپە كەم دەكات، هیچ ڕێڕەوێكی تایبەتی نەبوو بەخۆیەوە، بەڵكو لەسەر ڕێبازی سەلەفی چاكەكار بوو، لە هاوەڵان و شوێنكەوتوانیان بە چاكە، ڕەزای خوا لە هەموویان بێت، بەڵام شێخ ئەم بانگەوازەی لە نەجد و دەورووبەری ئاشكرا كرد و، دواتر جیهادی نەیارەكانی كرد و تاكو خوای گەورە ئایینی خۆی دەرخست و ئاشكرای كرد، شێخ و هاوەڵانی بانگەوازیان دەكرد بۆ هەق و، خەڵكیان پابەند دەكرد پێیەوە و، كاری ناهەقیشیان لێ قەدەغە دەكردن و، تیاندەخوڕی تاكو وازی لێبێنن، هەروەها كۆششی دەكرد لە نكۆڵی كردن و ڕەتكردنەوەی بیدعە و شتی بێ بنچینەی شەرعی تاكو خوای گەورە بانگەوازەكانی شێخی

کردە هۆکارێك بۆ لەنێوبردنیان، ئەمانەی کە باسمان کرد بریتی بوو لە دژایەتی کردنی خەڵك بۆ بانگەوازەکەی کە خۆی دەبینیەوە لە:

یەکەم: ڕەتکردنەوەی شیرك و بانگەواز کردن بۆ یەکتاپەرستی پاراو.

دووەم: ڕەتکردنەوەی بیدعە و شتی پڕوپووچ وەکو درووست کردنی بونیاد و مزگەوت لەسەر گۆڕ و مەولوودنامە و تەریقەت کە لەلایەن هەندێ دەستەی صۆفیەوە داهێنرابوون.

سێیەم: فەرمانی چاکەی بە موسوڵمانان دەکرد و، بە هێز ناچاریشی دەکردن کاری پێ بکەن، هەرکێ نکۆڵی بکردایە سزای دەدا و، هەروەها خراپەی لەسەر خەڵکی قەدەغە کرد و، سزاکانیان لەسەری جێبەجێ دەکرد و، خەڵکی وابەستە دەکرد بە کاری چاکەوە، بۆیە هەق و ڕاستی بڵاوەی کرد و، ناهەقی کپ کرایەوە، خەڵکی

کەوتنە حاڵێکی خۆش و، ڕێبازێکی چاکەوە لە بازاڕەکان و هەموو کاروبارێکەوە، بیدعە و شیرك لەو وڵاتە بنەبڕ کرا و، خراپەکاری لەنێو برا، بەڵکو ئەوکەسەی ئەوانی دەبینی حاڵی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی دەکەوتە یاد لە سەردەمە چاکەکانی ئیسلامدا.

چونکە خەڵکەکە لەسەر ئەو ڕێبازە دەڕۆیشتن و، ئارامیان دەگرت لەسەر ناخۆشیەکانی و کۆششیان دەکرد بۆی، بەڵام کاتێك هەندێ گۆڕانکاری درووست بوو لەپاش وەفاتی شێخ و وەفاتی زۆرێك لە کوڕەکان و شوێنکەوتووانی ڕەحمەتی خوایان لێبێت، ئەوکاتە ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە بوون و، بەرەنگاری دەوڵەتی تورکی و دەوڵەتی میسری بوونەوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (ﮬ ﮭ ﮮ ﮯ ﮰ ﮱ ﯓ ﯓ ﯔ ﯕ) دەپارێینەوە خوای گەورە ئەو ئازار و

ناسۆریە بکاتە لابردن بۆ گوناهەکانیان و پلەی شەهیدی ببەخشێتە ئەوانەی کە کوژران.

ئەو بانگەوازە هەر بەردەوام بڵاو دەبوویەوە، تاکو ئەم ڕۆژگارەی خۆمان، کاتێك سەربازە میسریەکان دەستیاندایە خراپەکاری لە ناوچەی نەجد و، کوشتن و ماڵ وێرانکردنیان بۆ خەڵکی هێنا لەپاش بانگەوازەکەی بە چەند ساڵێك، بەڵام بانگەواز هەر لە پەرەسەندندا بوو، (5) ساڵ دواتریش پێشەوا (ترکي بن عبدالله بن محمد بن سعود) ڕەحمەتی خوای لێبێت هەڵسا بە ئەرکەکانی بانگەواز و بڵاوی کردەوە لە نەجد و دەوروبەریدا، زانایان زۆربوون و، هەرچی تورکی و میسری بوون لەو دەڤەرە دەریکردن، لەساڵی 1240 ك جارێکی تر بانگەواز بڵاوبوویەوە و، شایەنی باسە ئەوان توانیبوویان لەساڵی 1233 ك درعیە وێران بکەن و حوکمی ئال سعود لەنێو

ببەن، ئەو پێنج ساڵەش لەناسۆر و ناخۆشی و پشێویدا دەژیان، بەڵام وەکو باسمان کرد موسوڵمانان لەساڵی هەزار و چوار سەد و چل موسوڵمانان لەسەر پێشەوا تورکی کوڕی عەبدوڵڵا کۆبوونەوە و، زانایان دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی کتێب و نووسراو بەناوچەکانی دەورووبەردا و هانی خەڵکیان دەدا بۆلای دینی خوا، ئاگری پشێوی کوژایەوە پاش ئەو هەموو جەنگە دوور و درێژە کە بەهۆی سەربازە میسریەکانەوە هەڵگیرسا بوو، خەڵکیش پاش ئەو ڕووداوانە سەرقاڵ بوون بە فێرکردن و ئامۆژگاری و ئاراستەکردن و، هەموو شتێك ئاسایی بوویەوە و، خەڵکی گەڕانەوە سەر کاروباری خۆیان وەکو سەردەمی شێخ و قوتابیەکانی ڕەزا و ڕەحمەتی خۆی لەسەر هەموویان بێت.

لەو ساڵەشەوە تاکو ئەمڕۆ سوپاس بۆ خوای گەورە بانگەواز هەر بەردەوامە و، بنەماڵەی سعوديش جێنشينی يەکتر دەکەن و، بنەماڵەی شێخ و زانايانيش هەر شوێنی يەکتر دەگرنەوە لە پێشەوايەتی و بانگەواز و جيهاد کردن لەپێناوی خوای گەورە.

بەڵام هەردوو حەڕەمی مەککە و مەدينە بۆ ماوەيەك هەر بە دابڕاوی مانەوە لە دەوڵەتی سعودی، تاکو لە ساڵی 1343 ك کەوتەوە دەستيان و، پێشەوا (عبدالعزيز بن عبدالرحمن بن فيصل بن ترکي بن عبدالله بن محمد بن سعود) توانی دەستيان بگرێتە سەر، تاکو ئەمڕۆش هەر لەژێر دەستی ئەم حوکمەتەدايە داواکارين لەخوای گەورە پاشماوەی (آل سعود) و (آل شيخ) و زانايانی موسوڵمانان هەموويان چاککاتەوە بۆئەوەی پشتگيری لە هەق و ڕاستی

بكەن و، ناهەق ڕیسوا بكەن و، دەپاڕێینەوە خوای گەورە بانگخوازەكانمان بۆ ڕێگای خۆی پشتگیری بكات بۆ هەڵسان بەو ئەركانەی كە لە سەریان واجبی كردووە و، ئێمە و ئەوانیش ڕێنوێنی بكات بۆ ڕێگەی ڕاستی و، هەردوو حەڕەمی مەككە و مەدینە و پاشكۆكانیان و هەموو وڵاتی موسوڵمانان بە بەرچاو ڕوونی و ئایینی ڕاست و مەزن و ڕاگرتنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئاوەدان بكاتەوە و، یارمەتی هەمووشمان بدات بۆ تێگەیشتن و دەست پێوەگرتن بە ئایینەكەیەوە تاكو دەچینە لای خۆی، خۆی خاوەن دەسەڵات و توانایە و دەتوانێت نزاو پاڕانەوەمان وەربگرێت.

ئەمە بوو دواترین ئەو شتانەی توانرا كۆبكرێتەوە بۆ پێناسەكردنی شێخ موحەممەدی كوڕی عبدالوهاب، دەربارەی بانگەواز و پشتیوانان و

دوژمنانی، خوایەگیان درووود و سڵاوی بێپایانت بڕژێنە سەر بەندە و پێغەمبەرەکەت و پێشەوامان موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا و یار و یاوەران و شوێنکەوتوانی بەگشتی و...الحمد لله رب العالمین.

عبدالعزیز بن عبدالله بن باز

# نووسەر لەچەند دێڕێكدا

- لەدايكبووی ساڵی 1974 لەشاری دوزخورماتوو.

- دەرچووی كۆلێژی پەروەردەيە بەشی زمانی عەرەبی لەزانكۆی كەركوك.

- دەرچووی پەيمانگای تەكنيكی يە لەشاری كەركوك.

- مۆڵەتی قورئان خوێندنی هەيە بە قيرائەتی (عاصم) بە هەردوو ڕيوايەتی (شعبة) و (حفص).

- قوتابی قيرائاتی عەشرەی قورئانە.

**تاكو ئێستا ئەم نووسينانەی بە چاپ گەيشتووە:**

1. ژياننامەی پێغەمبەر ﷺ (2) بەرگ (نارين) دار المعرفة / بيروت. (وەرگێڕان)

2. زەکاتی ماڵی بازرگانی چاپی دووەم. (دانان)

3. ژياننامەی (عبد العزيز بن عبدالله بن باز). (دانان)

4. ڕابەری ئەوانەی کە عومرە دەکەن (بەوێنە). (ئامادەکردن)

5. ڕابەری حاجيان (بەوێنە). (ئامادەکردن)

6. نزار قباني ولوثة الفكر الحداثي في شعره / کتێبخانەی نارين چاپی بەيروت. (توێژينەوە)

7. سەردەمی خيلافەتی ڕاشيدە (مجلد) پرۆژەی تيشك. (وەرگێڕان)

8. کۆتايی جيهان / نيشانە گەورە و بچوکەکانی قيامەت (بەوێنە) (نارين) دار المعرفة / بيروت (وەرگێڕان).

9. علماء الاسلام من هم و ماهي صفاتهم / کتێبخانەی تەفسير (وەرگێڕان بۆ عەرەبی).

10. (الجامع الصغير)ی السيوطي (2) بەرگ / لەژێر چاپدایە (وەرگێڕان).

11. شانۆگەری (زاناو ستەمکار)ی یوسف القرضاوي / لەژێر چاپدایە (وەگێڕان).

12. باوەڕ بە ڕۆژی دوایی (نارین) دار المعرفة / بیروت (وەرگێڕان).

13. شەرحی(الجزریە)بەکوردی(لەژێر چاپدایە)

- جگە لە چەند کتێبێکی تریش چاپ کراون و هەندێکیان چاوەڕوانی چاپ کردنن.

